# راپەڕینی جووتیارانی دەشتی هەولێر



## ساڵی ١٩٥٣

نووسینی عەباس نادر قادر



چاپی دووەم

2019

## زانیاری کتێب

ناوی کتێب : راپەرینی جووتیارانی دەشتی هەولێری ساڵی ١٩٥٣

نوسەر : عەباس نادر قادر

ساڵی چاپ : چاپی دووەم / ٢٠١٩

شوێنی چاپ : چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

تیراژ : (٥٠٠) دانە

پیت چنین : دیاکۆ کاوە نادر

پێداچوونەوە : مامۆستا حمەصالح فەرهادی

دیزان و نەخشەسازی : حکیم حاجی عوسمان دیبەگەیی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (٦٠٢)ی ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

دەشتی هەولێر یەکێکە لە دەشتە گەورە و فراوانەکانی باشووری کوردستان و لەڕووی کشتوکاڵیەوەش ناوچەیەکی بە پیت و بەرهەمە. ئەو دەشتە فراوانە پێش ڕاگواستن و بەعەرەبکردنی, ژمارەیەکی زۆر گوندی ئاوەدانی بەخۆیەوە گرتبوو, بەشی هەرە زۆری ئەو گوندانەش, بەکشتوکاڵ و مەڕدارییەوە خەریکبوون. ساڵی (سوندخواردن) کەلەساڵی ١٩٥٣دابووە, یەکێکە لە ڕووداوە دیارەکانی ئەو ناوچەیە, کە تێیدا بەشێکی بەرچاوی خەڵکی ناوچەکە ڕووبەڕووی زوڵموزۆری هەندێك لەئاغاکانی دزەیی بوونەوەو بوو بە ڕاپەڕینێکی دیار و دەنگی دایەوە.

جیاوازی دەشتی هەولێر و هەندێك لەناوچەکانی دیکە ئەوەبوو کەخەڵکی ناوچەکە, لەژمارەیەك عەشیرەتی جیاواز پێکهاتوون و هەموویان وەك بنەچە نەدەچوونەوە سەر یەك تیرە یان عەشیرەت و ئاغاکانی دزەییش لەبنەڕەتەوە خەڵکی ناوچەکە نەبوون و لەدەرەوەی سنووری ناوچەکەدا هاتبوونە ئەوێ, لەوێش بەهۆی زیرەکی و بەتوانایی خۆیان و هاریکاریکردنی حکومەت بۆیان و یەکنەگرتوویی و تاڕادەیەك ساویلکەیی بەشێکی خەڵکی ناوچەکەش, بوونە خاوەنی زۆربەی گوندەکان و دەستیان بەسەر زەویوزارە بەپیتەکەیدا گرت, خۆیان بەسەر ناوچەکەدا سەپاند و لەگەڵ دانیشتووانی ناوچەکەدا بوونە دووچینی جیاواز (ئاغا و کرمانج) و چەند جۆرە باجێکییان خستە سەر دانیشتوانەکەی, لەلایەکی دیکە ئاغاکان و خەڵکەکە,

بە پێچەوانەی زۆربەی ناوچەکانی دیکە لەیەك عەشیرەت نەبوون و هیچ کام لەم دوو چینە خۆیان بەبەشێك لەوی دیکە نەدەزانی .

ئەو نامیلکەیەی کە ئێستا لەبەردەستاندایە و بەناوی (ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێری ساڵی ١٩٥٣ ) یە و لەلایەن بەڕێز (عەباس نادر قادر ) ەوە نوسراوە , ساڵی ١٩٩٣ بۆ یەکەمین جار چاپکراوە و ئەوەی ئێستا چاپی دووەمییەتی و وای بەباش زانیوە لەڕووی ناوەڕۆکەوە لەو چاپەدا هیچ گۆڕانکارییەکی تێدا نەکات وەکو خۆی بهێڵێتەوە.

کاك عەباس , کەخەڵکی شارەدێی دیبەگەی دەشتی هەولێرە , مامۆستا و خاوەن بڕوانامە و نووسەریشە و شارەزاییەکی باشی لەمێژوو و جۆری ژیانی ناوچەکەدا هەیە , توانیویەتی لەم چەند لاپەڕەیەدا کورتەیەکی ئەو ڕاپەڕینە بخاتە بەردەستی خوێنەر و بەشێك لەمێژووی سیاسی و چینایەتی ناوچەکەی لەفەوتان بپارێزی .

من لەلایەن خۆمەوە دەستخۆشی لە نووسەر دەکەم و وای بەباش دەزانم هەوڵ بدات بۆچاپی سێیەم بابەتەکە فراوانتر بکات و بەچاپێکی نوێ و ناوەڕۆك و قەبارەیەکی گونجاوەوە بیخاتە بەردەستی خوێنەران و خەڵکی ناوچەکە و پێموایە هەوڵدان بۆ تۆمارکردنی ئەو جۆرە ڕووداوە ناوچەییانە ناچێتە خانەی ناوچەگەرێتی و لە ئەنجامدا دەبێتە بەشێك لە مێژووی نوێی کوردستان.

حەمە سالح فەرهادی

هەولێر ٧/٦/ ٢٠١٩

## پێشەکی چاپی دووەم

لەساڵی١٩٩٣ئەو نامیلکەم بۆ جاری یەکەم بەچاپ گەیاند ,بەناوی (ب.هەوران)بەلام چاپێکی هەژارانە,هەم ئامێری تایپ و دیزاین وەك ئێستا نەبوو,هەم هیچ دەزگایەکیش پاڵپشتی نەکردم,جگە لە رۆژنامەی ریگای رەنجدەران کە ئەوکات ١٠٠ دیناری سویسری پێدام , منیش بردم بۆ نووسینگەیەکی چاپکردن لەناو بالاخانەی حاجی یەحیا لەهەولێر,کە ئاشنایەتیم لەگەڵیان هەبوو یەکیان ناوی کاك محمد بوو ,یەکیشیان کاك سۆرانی ناوبوو ئەوی دیکەش کاك ئازاد مستەفا دیبەگەیی بوو ، ئەوانیش لەکۆی ماندوبوونەکەی خۆیان هاوکارییان کردم.

لەماوەی ئەو ٢٦ ساڵەی تەمەنی نامیلکەکە,نزیکەی ٢٠ کەسێك لێیوەرگرتووم, بۆ سوود بینیین لێی وەك زانیاری و سەرچاوە بۆ توێژینەوە و نووسینی بابەتەکانیان , بەلام بەداخەوە جگە لەکاك سالار سیامەند مەخموری کە وەك سەرچاوە ئاماژەی پێداوە و دانەیەکی بۆ ناردووم , ئەوانی ترم نەدیتووە و نەزانیویشمە ئاماژەیان پێ دابێت.

هەر لەماوەی ئەو ٢٦ ساڵەدا ٤ نامیلکە و پەڕتووکی مام ناوەندیم لەسەر هەمان بابەت , لەپەڕتووکخانەکان دیتووە, هەریەکە بەگوێرەی زانیاری و بیرکردنەوەی خۆیان بابەتەکەیان

نەوڵەمەندکردووە، ئەوەش بەڵگەیە بۆ کاریگەری ڕاپەڕینەکە لەناو دڵ و دەروون و هزری خەڵکی ناوچەکە.

کاتی خۆی کە ئەو نامیلکەم بلاوکردەوە بەچاپێکی هەژارانە و ٢٠٠ دانەم لێ کۆپی کرد، ئێستا جارێکی دیکە چاپمکردەوە بۆ ئەوەی هەم دیزاینی چاپەکەی جوانتر بخەمە بەردەستی خوێنەر، هەم ژمارەیەکی زۆرتر خوێنەر بیبینن و بیخوێننەوە، بەلام لە چاپی دووەمەمدا هیچ گۆڕانکارییەکم لەناوەڕۆکدا نەکردووە و هەروەك خۆیم هێشتۆتەوە، تەنها لەرووی زمانەوانی و هەڵەی چاپەوە دەستکاریم کردووە.

لە دووبارە چاپکردنەوەی ئەو نامیلکەیەدا هیچ مەبەستم نییە جارێکی دیکە، رك وکینە لەنێو دڵی جەماوەری ناوچەکە پەیدابکەمەوە و برینەکان بکولێنمەوە، بەڵکو تەنها مەبەستمە مێژووی ناوچەکە (دەشتی هەولێر) کەبەشێکە لەمێژووی گەلی کوردستان، وەك خۆی بنووسرێتەوە و رووداوەکان بکرێنە نووسین و ئەرشیفی مێژوویی بۆ نەوەکانی دواڕۆژ.

هیوادارم بەو نووسینە توانیبێتم مێژووچەیەکی جووتیارانی ناوچەکەم تۆمارکردبێ و مەزنێتی ڕاپەڕینەکەشم بەقەبارەی خۆی بەمێژووم کردبێ، کە لەراستیدا بۆ ئەو سەردەم خەبات و تێکۆشانێکی مەزنی جوتیاران و رەنجدەرانی

کوردستان بوو , لە داواکردنی مافە تایبەتییەکانییان و سنوور دانان بۆ زوڵم و زۆری و نەهێشتنی چەوساندنەوەی چینایەتی لەسەریان.

لێرەدا زۆر سوپاسی هەموو ئەوکەسانە دەکەم کە کاتی خۆی هاوکارییان کردوومە لەپێدانی زانیاری و گێڕانەوەی ڕووداوەکە , بەتایبەتی خاڵە مەحموود عەدۆی کەزۆربەی زانیارییەکانم لەسەر زاری ئەو گوێ لێ بووەو تۆمارکردووە.هەروەها سوپاسی هاوڕێیانی ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان دەکەم کەلەکاتی خۆی بە ٤ ژمارە بۆیان بڵاوکردمەوە,بەتایبەتی هاوڕێ مەلاحەسەنی نەمر.هەروەها سوپاسی ڕۆژنامەی ڕێگای ڕەنجدەرانی ئەو سەردەم دەکەم , کەهاوکارییان کردم,هەروەها سوپاس بۆ هەموو ئەو هاوڕێ و هاوکارانەی لەم چاپەدا پشتیوانم بوون و ماندیبوونیان کەوتە سەرشانی .

عەباس نادر قادر

هەولێر – کوردستان

٢٢-٦-٢٠١٩

## بەرگی چاپی یەکەمی ئەم کتێبە

# ((ڕاپەڕینی جووتیارانی دەشتی هەولێری ساڵی ١٩٥٣ ))

### لە ئابی ساڵی ١٩٩٣ چاپکراوە




**RAPERİNİ CUTIYARANİ**
**DEŞTİ HEWLERİ**
**SALİ 1953**

R. HEWRAZ

LE BILAWKIRAWEKANİ:

REKXIRAWİ TEKOŞANI RENCDERANI KURDISTAN

ABI 1993

## پێشکەشە بەگیانی زیندووی

١ - شەهید ڕەئوف کامل

٢ - خاڵە مەحمود عەدۆی نەمر

٣ - باوکی شەهیدم (مام نادر قادر)

٤ - جووتیارە شەهیدەکان و هەموو جووتیارە ڕاپەڕیوەکانی تر .

## پێشەکییەك

دۆزی کشتوکاڵی کێشەیەکی هەمە لایەنی ئابووری و کومەڵایەتی و سیاسییە، لەگەڵ پەیدابوونی سەرمایەداری ،کێشەکە قووڵتر بۆوە،چارەسەرییەکەی بەندە بە بوونی خاوەنێتی گشتیدا هۆیەکانی بەرهەم هینان،ئەمەش ئەستەمە لە ڕژێمە سەرمایەدارەکاندا ،چونکە سەرمایەداری چەند پێشبکەوێت ناتوانێ جوودایی لەنێوان گوند و شاردا نەهێڵێ و بەروبوومیش بەشێوەی یەکسان دابەش بکات و پێویستیەکانی ژیانی کشتکاری بەرهەمهێنەریش مسۆگەر بکات،واتە ناتوانێت بنبڕی کێشەکە بکات،چونکە باوەڕێکی ڕەهای بەخاوەنێتی تایبەتییدا هۆیەکانی بەرهەمهێنانەوە هەیە.

لەبەر ئەوەی وەك کوڕە جووتیارێك چاوم بە دەشتی هەولێر کراوەتەوە و لە خۆشی و ترشیدا لەگەڵ خەڵکەکەی ژیاوم و بە زێدی خۆمی دەزانم،بۆیە بە ئەرکێکی مێژوویی سەر شانی خۆم زانی،بەو نووسینە کەمێك لە قەرزی جووتیارە ڕاپەڕیوەکان بدەمەوە،کە ڕۆژانێك لە سەنگەری پێشەوە بوون لەململانێی چینایەتی بەرامبەر بە قبوڵنەکردنی ستەمکاری ئاغاکانی دزەیی و بەدەستهێنانی مافەکانیان.

هەر چەندە لام ئاساییە ئەم نووسینە پڕ بە پێست و خواستی تەواوی ڕاپەڕینەکە نییە و بێ کەموکورتیش نییە،لەگەڵ ئەوەش هەوڵم داوە زۆرترین سەرچاوە و باشترین زانیاری لەسەر کۆبکەمەوە، بە هیوام

ئەم نووسینە کەلێنەك لە مێژووی ڕاپەڕینی جوتیاران پڕبکاتەوە و ببێتە هاندەرێك بۆ زیاتر نووسین و توێژینەوە لەسەر راپەڕینەکە و گشت ململانێ چینایەتییەکانی تری نێوان جووتیار و دەرەبەگ.

ئەم نامیلکەیە پێشتر بە بۆنەی یادی چل ساڵەی راپەڕینەکە بە چوار بەش لە ڕۆژنامەی ((ڕێگای کوردستان)) ، ژمارە((٤٥ ، ٤٧، ٤٨، ٤٩ )) لەمانگی شوبات و ئاداری ١٩٩٣ دا بلاوکراونەتەوە، بەلام لێرە هەندێ زێدە نووسینی تێدا هەیە, چونکە هاوڕێیانی ڕۆژنامەی ناوبراو لە هەندێك شوێن کورتیان کردبۆوە ,جگە لەوەی ((پیلانی هەندێك لە شێخەکان)) کە پێشتر هاوڕێیانی ڕێگای کوردستان بە پێویستیان زانی بلاونەکرێتەوە ، وا لێرەدا بلاوی دەکەمەوە.دەمەوێت بلێم زۆربەی زانیارییەکانم لە جووتیارانی ناوچەکەو چەند کادیرێکی راپەڕینەکە وەرگرتووە , بە تایبەتی خاڵە((محمود عەدۆ))ی نەمر کە یەکێك بوو لە کادیرە چالاکەکانی راپەڕین و لە شەڕیی ((بازاڕگەی))ی نزیك مەخمووردا , ڕۆڵی سەرەکیی هەبوو.

لە کۆتایی دەڵێم سنگ فراوانم بەرامبەر بە هەموو رەخنەیەکی بەسوود.

**عەباس نادر قادر**

**١٩٩٢/٨/ ١٥**

# کورتە پێناسەیەکی دەشتی هەولێر

دەشتی هەولێر، دەشتێکی پان و فراوانە،هەموو گوندەکانی ناحیەی قوشتەپەو گوێڕو دیبەگە و قەزای مەخموور دەگرێتەوە.لەخۆیدا چەند دەشتێکی بچووك دەگرێتە باوەش وەك دەشتی پشت ڕێ(سەرووی جادەی کەرکووك-هەولێر)و ملکیەو شەمامك و کەندێناوەو قەراج،هەردوو زێی گەورەو بچووك تخوویی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاتی بۆ دەکێشن،چیای قەرەچوغ،دەشتی کەندێناوەو قەراج لێك جودا دەکاتەوە،زوورگی زوورگەزراویش دەشتی کەندێناوەو مولکیە لێك جودا دەکاتەوە.

دەشتی هەولێر،ناوچەیەکی دێمەکارییە , واتا بۆ کشتوکاڵ کردن پشت بە ئاوی باران دەبەستن،ئێستا نەبێت هەندێ بیری ئیرتوازی بەتایبەتی لە مولکیەو شەمامك لێدراوە و بۆ کشتوکاڵکردن بەکاردەهێندرێ ،بژێوی خەڵکەکە زیاتر لەسەر کشتوکاڵکردنی گەنم و جۆو بەخێوکردنی مەڕومالاتە.لەبەر بەپیتیی دەشتەکە،بەبوونی بارانی زۆر و نەبوونی گیروگرفتی کشتوکاڵی،خەڵکەکە خۆش گوزەران دەبن،جگە لەوەی ماستی هەولێر بەناوبانگییەکەی دەگەڕێتەوە بۆناوچەی دەشتی هەولێر،بەلام زۆر جار لەبەر کەم بارانی،خەڵکەکە تووشی نەهامەتی دەبن و ساڵەکە بە(نەهات) ناو دەبەن و تەنانەت جاری

واهەیە لە ترسی برسێتی بە کۆمەڵ کۆچیان کردووە بۆ ناوچەکانی خۆشناوەتی و ئاکرێی دەورو پشتیان.

لە ساڵانی پەنجاکان* نزیکەی (٥٠٠) گوندی تیادا ئاوەدان بووە، لەوانە نزیکەی (٢٠٠) گوند لەبەر دەستی ئاغاکانی دزەیی بوون،نزیکەی (٢٠) گوند لەبەر دەستی هەندێ خاوەن موڵکی هەولێری بوون ، کە بەئاغای هەولێری بەناوبانگن، گوندەکانی دیکە لەبەر دەستی عەشیرەتە بچووکەکانی ناوچەکە بوون، کە هەر گوندەی کێخوای خۆی هەبوو.

---

*مەبەست لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردووە

## چەوساندنەوەی جووتیاران لە ڕووی چینایەتییەوە

لە ڕژێمی دەرەبەگایەتیدا ،جووتیار بە مانای کۆیلەی زەوی دێت .لە کوردستان جگە لە زەوی و ئامرازی کشتوکاڵی تا ڕادەیەك هێزی کاری جووتیار مولکی دەرەبەگ بووە،بەلام دەستەلاتی ئەوەی نەبووە.لەگەڵ زەوییەکەی بیفرۆشێ وەك لە ئەوروپا باو بوو.

جووتیارانی دەشتی هەولێر، لەبەر ئەوەی لەیەك ئاستی ئابووری و خاوەنێتی زەوی نەبوون،چەوسانەوەش لەسەریان یەك ڕێژە نەبووە. بەڕادەی گشتی خاوەنێتی زەوی هی ئاغاکان بووە، بەلام ڕێژەیەکی کەمی جووتیار هەبوو پارچە زەوی لەخۆی زیاترې لەدەست دابوو، هەندێکی کەمیش مەمرەومەژی ، پارچە زەوییەکیان لەبەر دەست دابوو، بەلام ڕێژەیەکی زۆر بێ زەوی بوون،هەندێکیان لەلایەن ئاغاوە سالانە پارچە زەوی دەدرایێ بۆ خۆی بیکێڵێت لەبەرامبەر ئەوەدا موڵکانە بدات بە ئاغا، هەندێك لە جووتیارە بێ زەوییەکانیش وەك کرێکاری کشتوکاڵی لەلایەن ئاغاو خاوەن زەوییەکاندا کاریان دەکرد.

ئەگەر جووتیار بۆ ماوەی ساڵێك لەلای ئاغا کاری کردبووایە، پێی دەگوترا ((ڕێنجبەر)) کە هەقدەستی سالانەی جل و بەرگ و پێلاو و هەندێك لە داهاتی بەرهەم بووە. بەلام ئەگەر بە تەنها بە هاوین کاری بکردبووایە لە تاوتووکردنی داهاتی گەنم و جۆ پێی دەگوترا ((سەپان))

ئاغا هەر دەمێك بیویستایە دەیتوانی سەپان و ڕێنجبەر لای خۆی دەربكات.

جگە لەمانەش توێژێكی دیكەش كۆمەڵایەتی هەبوون وەك شوان و گاوان ، لە گوندەكانی دەشتی هەولێر شوان و گاوان و سەپان و ڕێنجبەر بە (ئاوخۆرەوە) دەناسران، لەگەڵ بوونی چەند خاوەن پیشەیەكی تر كە بە بەرژوازی بچووكی((ڕێنجبەر)) دەپۆلێندرێ وەك ئاسنگەر، پینەدۆز، ناڵبەند، بیرلێدەر، خمچی (كەجوولەكە بوون) لەگەڵ دوكانداروتەڕاح (كە گەنم و جۆیان دەكڕی و دەفرۆشت)، شێخ و سەید و مەلاش كە بەهۆی كاری ئایینیەوە ببوونە چینێكی مشەخۆر لەسەر جووتیاران، لەگەڵ توێژێكی دیكەی كومەڵایەتی كە پابەندبوون بە ئاغا , وەك سەركار و نۆبەتچی و كارەكەر و خزمەتكار.

لەو گوندانەی كە ئاغاكانی دزەیی دەستەڵاتیان هەبوو هەموو جووتیارێك دەبوایە ٢٠٪ی بەرهەمەكەی بدات بە ئاغا، لە١٠ سەر مەڕی زا، بەرخێك بدات بە ئاغا، جگە لەبوونی هەندێ سەرانە كە هیچ پەیوەندییەكی بەكاری بەرهەمهێنانەوە نەبوو،پێی دەوترا سەرانەی ئیلزامی نائابووری، ئەویش بەمانای هەموو خۆبەستنەوەیەكی

''التزام''دەرەبەگایەتی کە ناچێتە ناو کاری بەرهەمهێنانی رووتەوە (وەك باجی ژنهێنان و مردوو...هتد) [1] . نموونەش لەمانە زۆرە وەك:

١-لەکاتی مردنی جووتیارێکی بێ کەس و کار , هەموو میراتی جوتیارە مردووەکە بۆ ئاغا بووە.

٢-لەکاتی مردنی خزمێکی نزیکی ئاغا،پێویست بوو شتی وەك کاوڕ،ڕۆن،ماست،ساوەر،...هتد بۆ ئاغا ببردرێ بەناوی سەرەخۆشیانە.

٣-لەکاتی ژنهێنانی ئاغا یا کەسێکی نزیکی ئاغا پێویست بوو دیاری بۆ ببردرێت.

٤-لەڕۆژانی جەژن دەبووایە بە دیارییەوە بچێتە جەژنانەی ئاغا لەدیوەخان.

٥-لە کاتی بە شوودانی ئافرەتی جوتیاران، پێویست بوو دیاری بۆ ئاغا ببردرێت بەناوی سوورانە،جگە لەوەی دەبووایە ئاغا ڕازی بێ لە بەشوودانی کچە جووتیار.

٦-زۆربەی پێویستییەکانی دیوەخانی ئاغا وەك خواردن و خواردنەوە و سووتەمەنی لەلایەن جوتیارەوە دابین دەکرا.

٧-کاتێك میری داوای سەرانەی لە ئاغا بکردایە ،جووتیاران پێویست بوو بۆی ببژێرن.

---

(١) أ.شاميلوف ، حول الاقطاع بين الكرد ترجمة .كمال مظهر ل٣٧

٨-کاتێك ناخۆشی لەنێوان دوو بنەماڵەی جووتیار ڕووی بدابووایە،زۆر جار ئاغا ئاشتی دەکردنەوەو سەرانەی بە ناوی ((جەریمانە)) لێ دەستاندن.

**بێجگە لەو سەرانانە هەندێ کاری بێگاری لەلایەن ئاغا بە جووتیار دەکرا وەك:**

١-گواستنەوەی دەغڵودانی ئاغا بۆ شوێنێکی دیاری کراو.

٢-کۆکردنەوە و کێشانەوەی پێویستییەکانی بۆ مەڕو ماڵاتی ئاغا وەك کاو جۆ.

٣-قوڕکاری،پێویست بوو پایزان سەری خانووی ماڵی ئاغا سواخ بدرێت.

٤-ئێشکگرتنی بەشەو لە دیوەخان و ماڵی ئاغا.

٥-جووتیار دەبووایە خۆی ولاغەکەی هەمیشە ئامادە بێت بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی ئاغا.

٦-لەکاتی شەڕ و پێکدادان لەنێوان ئاغا و عەشیرەتێکی دیکە، دەبووایە جووتیار وەك شەڕکەرێك ئامادە بێت.

٧-ئافرەتە جووتیارەکان دەبووایە بە کۆمەڵ ساوار بۆ ماڵی ئاغا بکوڵێنن و بۆیان تاوتوو بکەن،جگە لە چەندان ئیشی دیکەی ناو ماڵ.

سەرەڕای ئەو هەموو سەرانە و بێگارییەشدا ڕۆژانە جووتیار بە شێوەی نامرۆڤانە لەلایەن ئاغاوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرا و هەر جووتیارێك سەربزێوی لە فەرمانەکانی ئاغا بکردبووایە، تووشی

چەرمەسەری و دەرکردن دەبوو لەگوندەکە.جاری واهەبوو , ئەگەر کچە جوتیارێکی جوان لە گوندێك بووایە ئاغاکان تەماعیان لیٚ دەکرد و هەر کەسێك بەرهەڵستیی بکردابووایە قورسترین سزا، پاداشتی دەبوو، ئەگەر کچەو بابی ناڕازی بوونایە سوکایەتیان پیٚ دەکرا، ئەگەر بەرێکەوت ئافرەتێکی ماڵی ئاغا حەزی لە کوڕە جووتیارێك بکردابووایە،دوا ڕۆژێکی ڕەش چاوەڕێی دەکرد. تائێستا ئاغاکانی دزەیی لە زۆر عەشیرەت و بنەماڵەی تر ژنیان هێناوە , بەس ئافرەتی خۆیان نەداوە بە کەس.

سەرکار، پیاوی دەمڕاستی ئاغا بوو، ئەوانیش زۆربەی کاری کشتوکاڵیی خۆیان و ماڵەوەیان بە جووتیار دەکرد و سەرانەشیان لیٚ دەستاندن. جووتیاری کورد لەبەر ڕێز و خۆشەویستیان بۆ ئایینی ئیسلام و نەزانین و نەخوێندەواری خۆیان، کوێرانە بەسترابوونەوە بە پیاوە ئایینیەکان.ساڵی جاریٚ دیارییان بۆ شێخەکانی تەریقەت دەبرد، مەلا و سەیدەکان سەرفترەیان وەردەگرت لە جووتیار، بە دوعا خوێندن ، زۆربەی شێخ و مەلاکان لەسەر رەنجی جووتیاران دەژیان، لەکاتی ڕێکەوتنی جووتیار بە دام و دەزگاکانی میری، پۆلیس و فەرمانبەران بایی خۆیان جووتیارانیان بە بەرتیل وەرگرتن دەڕووتاندەوە.

## تێکۆشانی چینایەتی جووتیارانی کوردستان

لە کۆتایی سەدەی ڕابردوو(سەدەی نۆزدەمیندا)،دەرەبەگایەتی لە کوردستان زیاتر لە جاران گەشەی بەخۆوە بینی، زۆربەی خێڵە کوردییەکان ڕوویان لە کشتوکاڵ کردو نیشتەجێی گوندەکان بوون کە زیاتر تەکانی بە گەشەی ئابووری دا بەتایبەت لە ڕووی بازرگانییەوە، لە دواییدا زۆربەی دەرەبەگەکان بوونە کۆسپ لە ڕێی زیاتری ئەم گەشەکردنەوە (پەیوەندی دەرەبەگایەتی کۆسپێکە لەسەر ڕێگای پێشکەوتنی بازرگانی، لە زۆربەی گوندەکانی کوردستان، بەبێ ئیجازەی خاوەن موڵك، هیچ کەس ناتوانێت خەریکی بازرگانی بێت , بەتایبەتی ئەگەر خاوەن موڵك باخی خۆی هەبێت) [٢] تا وای لێهات دەرەبەگەکان زۆرترین و باشترین زەوییان دەست بەسەر داگرت، ئەوەش زۆربەی جار لەلایەن جووتیارەوە ڕەت دەکرایەوە , تا کار گەیشتە پێکدادانی خوێناوی. لە کوردستان ڕاپەڕینی جووتیاران بە شێوەی پچڕ پچڕی و ناوچە تەسکی بوو , ئەویش لەبەر یەك ئاست نەبوونی گەشەکردنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان بووە.

لە کوردستانی باکوور لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم چیای ((گۆلێك)) لە جەزیرەی بۆتان ببووە پەناگەیەك بۆ جوتیارە یاخی و شۆڕشگێڕەکان بە کورد و ئەرمەن و ئاسوورییەوە ، بە سەرکردایەتی

(٢)- عەبدولرەحمان قاسملو , کوردستان و کورد ل١٨١

((تـالوور)) ناوێـك كـە جوتیـارێكی هـەژاری كـورد بوو،لـە ناوچـەی ماردین، جووتیاران لە كاتی بەرەو ڕووبوونـەوەی دەرەبەگـەكان توانیـان هەندێكیان لـێ بكوژن و هەنـدێكیش لـە گوندەكان وەدەرنێن،ئافرەت لـەم ڕاپەڕینانـەدا ڕۆڵـی شـیاوی خـۆی هـەبوو ، تەنانـەت ئافرەتێك بـە نـاوی ((غزال)) سەركردایەتی كۆمەڵێك جووتیاری شۆڕشگێڕی كرد،لـە دواییدا بـە یارمـەتی سـوپای عوسمـانلی ڕاپەڕینەكـە خـامۆش كـراو ڕێبـەری ڕاپەڕینەكە ((تالوور)) گیراو سوتێندرا.[٣]

لـە كوردسـتانی ڕۆژهەڵاتـدا،جووتیارانی ناوچـەی بۆكـان لـە سـاڵی ١٩٥٣ بۆ جێبەجێكردنی یاسای ٢٠٪ [*] لە بەرامبەر ئاغاكان ڕاپەڕین

---

(٣)- شامیلوف , حول الاقطاع بين الكورد ل٧٠-٧٢

( * ) یاسای ٢٠٪ یاسایەكی چارەسەری كشتوكاڵی بوو لەلایەن بەرژوازی ئێرانی لەسەردەمی دكتۆر مۆسەدەق دانرا،تیایدا ٢٠٪ بەرهەم لەخاوەن موڵك دەستێنرا، ١٠٪ ی بەرهەم دەدرا بە جووتیار و ١٠٪ تریش بۆ ئاوەدانكردنەوەی گوند بوو.

لە زۆر شوێنی بۆکان ئاغاکان گوندیان بەجێ هێشت، بەڵام دوای نەمانی دکتۆر مصەدقی سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتی ئێران، ئاغاکان گەڕانەوە گوندەکان و قەسابخانەیان بۆ جووتیاران دامەزراند. (٤)

کوردستانی باشوور زۆربەی ڕاپەڕینەکان لەدوای داگیرکردن و لکاندنی ئەو بەشە بوو بە عێراقەوە.هۆی سەرەکیش لە ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکارییەبوو کە بەسەر بازاڕی کوردستان و پەیوەندیی دەرەبەگایەتی داهات،وەك بەهێزبوونی ناوەندێتی حکومەت بووە هۆی لاوازی دەسەلاتی (سەربەخۆی)دەرەبەگەکان،لەئەنجامدا ناکۆکیەکیان زەقتر خۆیان نیشان دەدا،جگە لە کارلێکی ڕاستەوخۆی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان و بزوتنەوەی دیموکراتی عێراق، کە تێیدا جووتیاران پێشکەوتووخوازو زۆرینەکەی ئەو کات بوون.

سەرەتا راپەڕینەکان رەمەکی و بچووك بوون لە قەبارەی گوندێك یان عەشیرەتێك دەرنەدەچوو،داواکارییەکانیش سادە بوون، بەلام بەرەبەرە خۆی لە فراوانی ناوچەو رێکخراوبوون و دروشمی سیاسی

---

(٤) کریم حسامی , قافله من شهداء ثورة کردستان / ایران ل٣٠

دیتەوە، هەرچەندە ڕاپەڕینەکان زۆربەیان لە بوارێکی تەسک خولیان خواردۆتەوە، بەڵام کاریگەرییان لەسەر یەکتر هەبووە، بۆنموونە ڕاپەڕینی جووتیارانی گوندەکانی (خدر جیجە و غەرابە و دەربەند) لە ساڵانی لە ١٩٢٩-١٩٣٠ , ڕاپەڕینی جووتیارانی گوندەکانی ( دێمەکار و کاریتان و گردەشینە.....هتد)، لە ساڵانی جێبەجێکردنی یاسای تەسویە بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٣٩،لە دەشتی کەندێناوەی هەولێردا. هەروەها ڕاپەڕینی جوتیارە کوردەئێزیدیەکانی گوندی (ڕۆمبۆس) لە سەرووی شەنگال لە ئەیلولی١٩٤١ لە دژی شێخەکانی شەمەری عەرەب[(٥)] , ڕاپەڕینی جووتیارانی گوندی (وەراز و دۆڵێ و کاپیلۆن) ی ناوچەی شاربازێڕ لە سەرەتاو ناوەندی چلەکان[(٦)]، ڕاپەڕینی جووتیارانی عەربەت لە شارەزوور لە ساڵی ١٩٤٨،کە وەك بزوتنەوەیەکی ڕێکخراو دروشمی ئابوری و سیاسی بەرزکردەوە و ئاڕاستەی حکومەتیان کردبە شێوەی سکاڵانامە[(٧)] ، ڕاپەڕینی جووتیارانی بانی خێڵان و هۆرین و شێخان (مەیدان) و گوندی وارماوە لەسەرەتای پەنجاکان و ڕاپەڕینی جووتیارانی دەشتی هەولێر لە ساڵی ١٩٥٣ و ڕاپەڕینی جووتیارانی بیتوێن لە ساڵی ١٩٥٤، لەگەڵ ڕاپەڕینی جوتیارانی گوندی (قەرەوڵە)

(٥) - نصير سعيد الكاظمي،الحزب الشيوعي العراقي والمسألة الزراعية في العراق ل١٨٢

(٦)- رؤوف محمد زهدي، بۆ لەهەقە کەوتنە تەقە ل ١١

(٧)- د.كمال مظهر،صفحات من تأريخ العراق المعاصر ل ١٤

لە ناوچەی زاخۆ لە ساڵی ١٩٥٥[٨]. دەتوانین بڵێین ڕاپەڕینەکانی جووتیارانی کوردستانی باشوور لە ڕاپەڕینی عەربەتەوە شێوەی ڕێکخراوەیی بەخۆیەوە گرتووە،بەتایبەتیش ئەو کات ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی عێراقی دەوری سەرەکییان تێدا گێڕاوە و ڕێکخەر و هاندەر بوونە.

## باری ناوچەکە پێش ڕاپەڕین

ئاغاکانی دزەیی لە چوار بنەماڵە پێکهاتبوون، لە بنەچەدا هاوخوێنن[(*)] ، بەڵام هەمیشە ناتەبا بوونە لەگەڵ یەکتر لەسەر زەوی و گوندەکان،شەڕی خوێناویی نێوانیشیان زۆر جار کارەساتی دڵتەزێنی بە دیاری بۆ جوتیارانی ناوچەکە هێناوە،بێ ئەوەی جوتیاران یەک تۆزقاڵ بەرژەوەندییان لەوشەڕانەدا هەبێت بەڵام کاتی مەترسی ئەوکی گرتوون و پایە ودەسەڵاتییان لە لەقبوون بووە ،هەموو ناتەباییەکی خۆیانیان تووڕداوە , تەنانەت ئاغا خوێندارەکانیش لەگەڵ یەک لەسەر یەک ڕایەخی

---

(٨)- نصير سعيد الكاظمي،الحزب الشيوعي العراقي والمسألة الزراعية في العراق ل١٨٥-١٩٩

(( * )) ئاغاکانی دزەیی ، لەبنەرەتدا خەڵکی گوندی (دزەی) کوردستانی ڕۆژهەڵاتن لەدوای جوتیاران هاتوونەتە دەشتی هەولێر،واتە هیچ پەیوەندیەکی عەشیرەتی و هاوخوێن لەنێوان جوتیارانی ناوچەکەو ئاغاکانی دزەیی نییە.

دیوەخان دانیشتوون و بەرامبەر جوتیارەکان هاوپیلان بوونە،هەروەك لە ڕاپەڕینەکەی ١٩٥٣دا بەدەر دەکەوێت.

زۆربەی ئاغاکانی دزەیی بەپێی بەرژەوەندیی چینایەتییان سەر بە حکومەتی عێراقی بوونە، تەنانەت هەندێکیان دژی بزووتنەوەی نیشتمانی کوردستانیش وەستاون، لەو سەردەم(خدری پاشا)و(مەعروف حاجی پیرداود) دوو ئاغای ناوچەکە بوون، هەر یەکەو برا گەورەی بنەماڵەیەك بوون و ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی بوون، بەڵام ناتوانرێ نکوڵی لەوە بکرێ هەندێ لە کوڕە ئاغاکان بەتایبەتی ڕۆشنبیرەکانیان لەو سەردەم ڕۆڵی جوامێرانەیان هەبووە لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردستاندا وەك خوا لێخۆشبوو (ئەحمەد حەمەدەمین ئاغا)، تەنانەت هەندێکیان ئەندام بوون لە(حزب التحرر الوطني) کە ڕووی ڕاستی حزبی شیوعی عێراقی بوو، وەك کوڕەکانی (حوسێنی مەلای) ئاغای قازیخانە.

دەستڕۆیی ئاغاکان لەهەموو لایەنەکانی ژیان بەهۆی بوونی چەندان کاربەدەست لەناو دەزگاکانی میری و خۆبەستنەوە بە سیاسەتەکانی حکومەتی ئەو کات , دەست تێکەڵاوکردن لەگەڵ شێخەکانی ناوچە و هەبوونی بەرژەوەندی تایبەت لەگەڵ شێخ و پیاوە ئایینییەکانی ناوچەکە، بووە هۆی ڕووتاندنەوەیەکی بێ وێنەی جووتیاران و بەستنەوەی ژمارەیەکی زۆر لە جووتیاران بە خۆیانەوە ,

هـــەروەك مـــاركس دەڵێـــت (توانـــای دەرەبەگـــەكان وەك زۆربـــەی دەستەڵاتدارەكانی تر بە شێوەیەكی گشتی بە سەرانە دیاری ناكرێ، بەڵكو بە ژمارەی ئەو كەسانەیە كە پێوەی بەندە.واتە ئەو جووتیارانەی ئابووری تایبەتیان هەیە لە لایەن ئاغاكان دەڕووتێنرێنەوە ))[٩] .

راپەڕینە بچووكەكانی ساڵانی تەسویە (١٩٣٩) لە گوندەكانی كەندێناوە و ناوچەكانی دیكەی دەشتی هەولێر سامی دێوەزمەی لە دڵی جووتیاران شكاندبوو،جگە لەوەش پێش راپەڕین رێكخستنەكانی حزبی هیوا و شۆڕش و رزگاری و شیوعی و پارتی لەسەرەتای چلەكانەوە لەنێو جوتیارانی ناوچەكە سونگی رەشماڵی سیاسی خۆیان داكوتابوو.هەموو كارە شۆڕشگێڕییەكانی هەولێر و ناوچەش زیاتر تەكانی پێ دەدان. بۆ نموونە خۆپیشاندانی كرێكارانی هێڵی شەمەندەفەری هەولێر-كەركوك لە ساڵی ١٩٤٧ و ١٩٤٨ بەدواوە، زیاتر ئاستی هۆشیاریی سیاسی بەرز كردبوونەوە.

(٩) أشاميلوف حول الاقطاع بين الكرد ل٨٠

لەلایەکی تر ساڵح جەبری کۆنە سەرەك وەزیرانی ساڵی ١٩٤٨، لە بەهاری ١٩٥٢دا , سەردانێکی دەشتی هەولێری کردو , چاوی بە زۆربەی ئاغاکانی دزەیی کەوت و پشتگیری خۆی بۆ دەربڕین.لەبەر بوونی بیروباوەڕی کۆمۆنیستی و دیموکراتی لەناو جوتیاران کە وەك زەنگی کڵێسە بانگی راپەڕینی دەدا.

## هۆیەکانی راپەڕین

هەموو کارێکی شۆڕشگێڕی پێویستی بە بارودۆخی بابەتی و تایبەتی هەیە،پێوەری چارەنووسییەکەشیەتی، لێرە هۆیە سەرەکیەکانی راپەڕین دیار دەخەین:

١- نزیکبوونەوەی ناوچەکە لە هەر سێ شاری هەولێر-کەرکووک-مووسڵ، دەشتایی ناوچەکەش ئامانی زیاتر دەدا بە هاتووچۆی نێوانیان، ئەمەش لە خۆیدا زیاتر ئاگاداری شارستانی بە جووتیاران دەبەخشێ، بەتایبەت بوونی چەند قوتابخانەیەك لە ناوچەکەدا.

٢- نەبوونی سۆزی عەشایەری لەنێوان ئاغاو جووتیارانی ناوچەکە،چونکە لەیەك منداڵدانی عەشایەری نەبوون و لەسەرەتای هاتنیان بۆ ناوچەکە بەپاڵپشتی سوڵتانی عوسمانی بەزەبر و تەڵەکەبازی دەستیان بەسەر زەوییی گوندەکان داگرت. هەربۆیەش بە چاوی رقەوە لەلایەن جوتیاران سەیر دەکران.

٣- هەڵخەڵەتانــدنی جووتیـــاران لەلایـــەن ئاغاکانـــەوە لـــە کـــاتی جێبەجێکردنی یاسای (تسوية حقوق الأراضي)ژمارە ٢٩ ساڵی ١٩٢٩ کە زۆر لە زەوی جووتیاران، ئاغاکان بەناوی خۆیان تاپۆ کرد.

٤- خۆ بەستنەوەی زۆربەی ئاغاکان بە حکوومەتی عێراقی و بەریتانی و دژایـــەتیکردنی بزوتنـــەوەی کۆمۆنیســـتی و رزگـــاریی نیشـــتمانیی کوردستان کە جووتیاران کۆڵهەڵگری یەکەم بوون.

٥- سروشتی ململانێی نێوان ئاغا و جووتیاران گەیشتبووە رادەیەك،لە ئـەنجامی زۆری سـتەم بەسـەر جووتیـاران و کۆسـپ خسـتنە سـەر رێـی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابووری لەلایەن ئاغاکانەوە.

٦- بـێ هێزیـی دەسـەڵاتی ئاغاکـان لـە پاراسـتنی جووتیـاران لەبـەردەم دەزگاکانی دەوڵەت لەچاو پێشتر.

٧- بوونی هەوای بەزم و گەشتوگوزار لە کەللەی ئاغاکانی دزەیـی لەبەر گـەرمیی ناوچـەکە لـەهاوین وەك چـوون بـۆ بەغـدا و ئەسـتەنبۆڵ و لەندەن..هتد.ئەمەش پێویستی بە گیرفانی گەرم هەبوو کە پارەی تێدا بـێ، کـە لـە زیـاتر رووتاندنـەوەی جووتیـاران و دزیـنی رەنجیـان دەستدەکەوێت.

٨- ســەرکەوتنی یــەکێتی سـۆڤیەت لـە شـەڕی دووەمـی جیهـانی و بڵاوبوونەوەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی و دیموکراتی لە ناوچەکە پـەرەی سەند.

٩- بزووتنەوەی دیموکراتی عێراق و بزووتنەوەی ڕزگاری نشتیمانی کوردستان هەنگاوی گەورەی بەخۆیە بینیبوو.

١٠- بڵاوبوونەوەی ڕێکخراو و حزبە چینایەتی و پێشکەوتوخوازەکان لە ناوچەکە، بەتایبەتی لەو سەردەم حزبی شیوعی عێراقی، جەماوەرێکی بەرفراوانی جووتیارانی لەخۆ کۆکردبۆوە،هەروەك یەکەم کۆمەڵەی نهێنیی جووتیارانی لە گوندی مورتکەی سەر بە ناحیەی قوشتەپە لە ساڵی ١٩٥٣دا دامەزراند [١٠]، هەروەها پارتی دیموکراتی کوردستانیش، جەماوەرێکی تەواوی جووتیاری لەگەڵدا بوو , بەڵام کەمتر لە حزبی شیوعی.

(١٠) – نصير سعيد الكاظمي،الحزب الشيوعي العراقي والمسألة الزراعية في العراق ل٢٣٤

## دەستپێکردنی ڕاپەڕین

گەرماپێوی نێوان ئاغاو جووتیاری ناوچەکە لەبەرزبوون دابوو، پێویستی بە یەکلابوونەوەی کێشەکەش دەکرد،دەروازەی ڕاپەڕین گوندی (قازیخانە)ی سەر بە ناحیەی قوشتەپە بوو. لەکۆتایی مانگی شوباتی ساڵی دا١٩٥٣ (حوسێنی مەلای) ئاغای گوندی قازیخانە، داوای لە جووتیارانی گوندەکەی کرد ئەوەی جووت بە ڕەشەوڵاخ بکات، دەبێ یەك عەلبەگەنم واتە (١٦ تەنەکە) و ئەوەی جووت بە گوێدرێژ بکات نیو عەلبە واتە(٨تەنەکە) بدات.ئەم داوایەی ئاغاش لەو سات دیاربوو تەشقەڵە بوو،بۆیە جووتیاران وتیان:ئاغا ئێمە هەموو سەرانەی پێویستمان داوە ئەوە مانای چیە؟ ئاغا وتی:ناوی (ئەستەنبۆڵانە)یە، چونکە دەچمە ئەستەنبۆڵ، پێویستم بەپارەیە، لەبەر ئەوەی جووتیاران داواکەی ئاغایان لە توانا نەبوو، بۆیە بڕیاری نەدانیان دا. بۆ ڕۆژی دوایی ئاغا داوای گەنمی لێکردن بەڵام هەروەك بڕیاربوو کەس داوای ئاغای جێبەجێنەکرد، لەبەر ئەوە ئاغا تووڕە بوو , پاش چەند ڕۆژێکی دیکە ئاغا جووتیارانی گوندەکەی کۆکردەوەو داوای ١٦ وڵاخ و ١٦ جووتیاری کرد بۆ بێگاری پێکردن. هەڕەشەی لێکردن هەر جووتیارێك سەرپێچی بکات توندترین سزا دەدرێت. بۆ ئەم مەبەستەجووتیاران لەنێوان خۆیان کۆبوونەوەو بڕیاریان دا هاتووچۆی دیوەخانی ئاغا نەکەن و سەرانە و بێگاری نەمێنێ لەسەریان و بەکۆگەلی پشتی یەك

بگرن لەبەرامبەر دەست درێژیی ئاغا بۆ سەر هەر جوتیارێك. هەوڵی کۆکردنەوەی چەکیان داو،گوندەکانی دەوروپشتی خۆیان ئاگادار کردەوە بۆ پشتگیری لێ کردنیان.

کاتێ ئاغا بۆ بەیانی جووتیارانی بۆ بێگاری داواکرد،بینی هەمووی چەکدارن و لەدەوری یەك کۆبوونەتەوەو داواکەی ئاغاش جێبەجێ ناکەن بۆیە لەترسان هەترەشی چوو , یەکەوسەر هەواڵی گەیاندە دەزگای پۆلیس لەهەولێر و قوشتەپە پێی ڕایگەیاندن (جووتیارانی گوندەکەم هەمووی بوونەتە شیوعی و کافر , چەکیان هەڵگرتووە دژی حکومەت و و مەلیك قسان دەکەن).

حکومەتیش بۆ پاراستنی ئاغا و تەشەنە نەکردنی کێشەکە یەکسەر پۆلیسی بۆ گوندەکە نارد،تا جووتیارانی گوندەکە چاوترسێن بن.بەڵام ڕاپەڕینەکە وەك پووشی ئاگر تێبەر بوو تەشەنەی بۆ گوندەکانی دیکەش کردبوو،بۆیە حکومەت بەناچاری پۆلیسی بۆ گوندەکانی تریش نارد کە نزیکەی ٢٠٠ گوندی گرتەوە.جووتیارانی ناوچەکە هەر گوندەو بەتەنیا کۆدەبوونەوەو(ڕیش سپی)یان بۆ خۆیان هەڵدەبژارد و هەمووش

بە کۆمەڵ سوێندیان دەخوارد(*) ، ئەوەی ژنی هێنابوو بە تەلاق، ئەوەی دیکە دەستی بەقورئان دادێنا کە (شەڕمان شەڕ بێ خێرمان خێر بێ) بۆ زیاتر شەرعیەت دان بە کێشەکەیان لەگەڵ بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارانە لەگەڵ ئاغا , دەستیان بە مەزبەتە نووسین کرد بۆ جێ بەجێ کردنی داواکانیان کە خۆی زیاتر لەم خاڵانەدا دەنواند:

١- کەمکردنەوەی سەرانە لە ٢٠٪ بۆ ٥٪.

٢- نەمانی بێگاری ، ئەگەر ئیش بۆ ئاغاش بکرێت دەبێ دەسهەق وەربگیرێ.

٣- دابەشکردنی زەوی ئەمیریە بەسەر جووتیاران.

٤- لەخۆت و خۆڕایی نابێت جوتیار دەربکرێت.

هەر لەسەرەتای ڕاپەڕین جوتیارە هۆشیارەکان کە خۆیان لە ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی دەبینییەوە، بەپیر بانگەوازەکە چوون و بوونە هاندەر و ڕێکخەری ڕاپەڕینەکە.

---

(*) تەنانەت ئەم ساڵە لای جوتیارانی ناوچەکە بە ساڵی (سوندخواردن) سوێند خواردن بەناوبانگە،یاخود ساڵی (شەڕی ئاغا و کرمانجان)، کرمانج بەمانای جوتیار دێت لەدەشتی هەولێر.

## هەڵوێستی حکومەتی پاشایەتیی عێراقیی

حکومەتی پاشایەتیی عێراق نوێنەری کۆنەپەرستترین چینی ناو کۆمەڵگای عێراق و گرێدراوی ئیمپریالیزمی بەریتانیا بوو، زۆربەی سەرۆك عەشیرەت و شێخ و ئاغاکانی کوردستانیش بەهۆی داگیر کردنی کوردستان و لکاندنی بەعێراقەوە وەك چینێکی بەکرێگیراو وردە بەرژەوەندیی خۆیان لەو حکومەتەدا دەدیتەوە،بەکورتی حکومەتی پاشایەتی پشت و پەنابوو بۆیان ، ئەوانیش بوبوونە داروەدەست و گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان.

حکومەت هەر لەگەڵ ئەوەی گوێبیستی ڕاپەڕینەکە بوو، یەکسەر کەوتە نەخشەدانان بۆ کوژاندنەوەی ژیلەمۆی ئەو ڕاپەڕینە،چونکە ترسی ئەوەی هەبوو نەبادا ڕاپەڕینەکە سەرتاسەری کوردستان و عێراق بگرێتەوە،بۆ ئەم مەبەستەش هێزێکی قەبەی لە پۆلیس لە خوارووی عێراقەوە بۆ ناوچەکە هێنا بەناوی (قوة السیار)کە کاریان سووڕانەوە بوو بەناو گوندەکاندا , ئەویش زیاتر بۆ پاراستنی ئاغاکان و ترساندنی جووتیاران بوو، لەبەرئەوەی هێزێکی سەرکوتکەرو دژی داخوازیی جووتیاران بوو، لە زۆر شوێن وەك شەڕی (بازاڕگە)ی نزیك مەخموری و شەڕی (گردلانکە)ی سەر بەناحیەی قوشتەپە.

هاوکات لەگەڵ هاتنی پۆلیس بۆ گوندەکان , لە زۆر شوێن بە نامرۆڤانە جووتیاران شەهید دەکران، وەك لە گوندی (میرزا ئاغا) دوو

برای جووتیار بەناوی (حوسێن ڕەسول و مەولود ڕەسول) شەهید کران، چـونکە ڕازی نـەبوون سـەرانە بـدەن بـە ئاغا.هـەروەها لـە گونـدی (کەردن)جووتیارێك بەناوی (ئەبو زێد)و لە گوندی(ماجیداوە)جووتیارێك بەناوی شێخ محەمەد عەباس شەهید کران.

پـۆلیس بـۆ زیـاتر چاوشکاندنی جووتیـاران (ڕەحمانـە شـەل)یان گرت , کە یەکێك بوو لە ڕێبەرانی ڕاپـەڕین، ١٦ڕۆژ لە ئوتۆمۆبیلیـان گرێ داو بـەناو گوندەکانیانـدا دەگێڕا،بەڵام ڕەحمانە شەل نەبەردانە لە پـێش چاوی پۆلیس و ئاغاکان بە جووتیارانی دەگوت:گرتن و گیرانی من تەنها بۆ چاوشکاندنی ئێوەیە , ئێوەش نەکەن واز لە داواکاریـەکانتان بینن , ورەتان پیێ نەرووخێ.

لـە کۆتـایی بـەهاردا کـاتێ دروێنـەی گـەنم و جـۆ دەسـتی پێکـرد لەسەر قسەی ئاغاکان لە هەر گوندەی (٣-٤) جووتیار لەلایەن پۆلیسەوە گـیران , بەتایبـەتی ئـەو گوندانـەی جووتیـاران بـەردەوام بـوون لـە بەربەرەکانێ کردنی ئاغا.ژمارەی جووتیارە گیراوەکان گەیشتە نزیکەی (١٥٠) کەس هەندێکیان لە بەندیخانەکانی کەرکووك و مووسڵ و هەولێر (١-٣) سـاڵ بەندکران.هەنـدێکیان پـاش (٦) مـانگ بـە کەفالـەت بەردران.کۆمـەڵێك لـە جووتیـاران بەتایبـەتی ئەوانـەی ڕۆڵـی تایبـەتییان هـەبوو لـەناو جوتیارانـدا دوور خرانـەوە بـۆ (ڕانیـە) ئینجـا دوایـی هێنایانەوە بۆ گوندی (لاسۆر)ی سەر بە مەخموور.

حکومەت لەگەڵ بەکارهێنانی کاری تۆقێنەر , هەندی شێوازی تریشی گرتە بەر ،وەك گۆڕینی هەندێ لە کارگێڕانی دامودەزگاکانی هەولێر بۆ نمونە (مستەفا یەعقوبی)ی خانەنشینکراو ، کرایەوە بە موتەسەریفی هەولێر،جەمیل بەگ بە بەڕێوەبەری پۆلیسی هەولێر،ئەم دوو کەسە کاری خراپیان کردە سەر دەروونی جووتیارە راپەڕیوەکان،ئەویش بە هاندانی جووتیاران بۆ گرتنەبەری شێوازی نەرم , وەك (مەزبەتە) نوسین و وازهێنان لە کاری شۆڕشگێڕانە.

بۆ زیاتر پشتگیری لە جووتیارە راپەڕیوەکان لە هەولێر ویسترا خۆپیشاندان ساز بکرێت، هەرچەندەحکومەت چوار دەوری هەولێری بە پۆلیس تەنیبوو ،بەڵام جووتیارێکی زۆر خۆیان گەیاندە ناو شار، سەعاتێك پێش خۆپیشاندان سەرکردەی خۆپیشاندەران ناوی (عوسمان) بوو گیرا پۆلیس بەدوای هەندێ ناوی تردا سووڕانەوە ئیتر خۆپیشاندان نەکرا.

لە پایزی ١٩٥٣دا جێگری سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتی عێراق (محەمەد عەلی مەحمود) هاتە هەولێر وەك کارێکی سەر پێیی چاوێکی بە کێشەی جووتیاران داهێنا . چاوی بە هەندێك ئاغا و جوتیار کەوت. راپەڕینەکەی بە کارێکی دژی حکومەت و جووتیارانی بە گێرەشێوێن و شیوعی دانا.بەڵام بۆ چاوبەستنەوەی جووتیاران (٣) جووتیاری بەندکراوی بەردا،چونکە مەزبەتەیەکی زۆری جووتیارانی چووبووە پێش.

## هێزی بزوێنەری ڕاپەڕین

ئەو رقە کۆنەی کە لەمێژ ساڵ بوو لە ناخی جووتیارە بێ دەرەتانەکان پەنگی خواردبۆوە، لە یەکەم ڕۆژی ڕاپەڕینەکە کەلەبەرێکی دیتەوە ئەسپی ئاغاکانی هێنایە لغاو کردن، نیشانیدا ئەگەر چەوساوەکان یەك بن چەوسێنەران بۆ ماوەیەکی کورتیش ناتوانن بەرامبەریان بوەستن و بەزووییش بۆیان دێنە چۆکدادان.

١-جووتیارە دەوڵەمەندەکان، ئەوانەی کە پارچە زەوییەکی زیاتریان لەخۆیان هەبوو،بەڵام خۆشیان کاریان تێدادەکرد،بە حوکمی بارە ئابووریەکە زیاتر هەڵسوڕێنەری ڕاپەڕینەکە بوون،زۆریان لە کۆتایی ڕاپەڕینەکەدا ئاشت بوونەوە لەگەڵ ئاغا.

٢-جووتیارە هەژارەکان ، ئەوانەی پارچە زەوییەکیان لەبەر دەست دابوو کە بەشی بژێویانی نەدەکرد لەگەڵ ڕاپەڕینەکە بوون .

٣-ئاوخۆرەوە(ئەو گوندیانەی زەوییان نەبوو وەك سەپان و ڕەنجبەر و شوان و گاوان ........هتد) بەبێ هیچ دوو دڵییەك لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە ریزی پێشەوەی ڕاپەڕینەکە بوون،زۆریشیان بۆ شارەکان کۆچیان کرد.

جگە لەمانە مەلاکانی لادێ هەندێکیان بە حوکمی خوێندەواری پایە و ڕێزیان لەنێو جووتیاراندا هەبوو ، لە زۆر گوند بوونە ڕێبەری جووتیارەکان و هەڵوێستی جوامێرانەیان نواند، بۆ نموونە (مەلا

محەمەدی شێروانی) لە گوندی قەپڵان دوو ساڵ لە بەندینخانەی کەرکوك گیرا،چونکە داکۆکیی لە هەڵوێستی جووتیاران دەکرد. (مەلا شەریفی عالّایی) کاتێ لەلایەن پۆلیس گیرا جووتیاران بەیەك ڕۆژ هەموو دەغڵی مەلایان دروێنە کرد. مەلا یەحیای گوندی ماجید داکۆکییەکی بێ وێنەی لە جووتیاران کرد. هەروەها (مەلای ڕەش) لە گوندی چەغەمیرە لەبەردەم موتەسەریفی هەولێر و ئاغادا , بوێرانە داکۆکی لە جووتیاران کرد.

ئافرەتان ڕۆڵی شیاوی خۆیان هەبوو , هەمیشە لە پشت برا و باوك و مێردەکانیاندا بوون.بۆ نمونە کاتێ تراکتۆری ئاغا ویستی زەوی جووتیارەکان لە گوندی(کەندالّەقەل) بکێڵێ , ئافرەتان بە کۆمەکی کەوتنە بەردبارانکردنی تەراکتۆر و پۆلیس تا دیوەخانی ئاغا. جگە لەمەش شانەی ئافرەتان هەبووە یارمەتی داون بۆ نمونە لە گوندی (هەرەجە) ئابوونەی مانگانەی شانەی ئافرەتان (٣) درهەم بووە دراوە بە جووتیارە ڕاپەڕیوەکان . بۆ مێژوو دەبێ بوترێ کچی یەك لە ئاغاکان بە نهێنی یارمەتیی مادیی و مەعنەویی جووتیارە ڕاپەڕیوەکانی داوە.

## ڕۆڵی پارت و کەسانی پێشکەوتووخواز

چونکە ڕاپەڕینەکە پێشکەوتووخوازانە بوو ، چەندان داواکاریی مرۆڤانەی جووتیاران بوو. هەر بۆیە هێز و چینە کۆنە پەرستەکان بەهەموو شێوەیەك دژی وەستان ، لەبەرامبەر ئەمەش هێزە پێشکەوتووخوازەکان بەهەموو توانایانەوە پشتگیری و یارمەتیی جووتیارانیان دا.

پارتی دیموکراتی کوردستان، جەماوەرێکی تایبەتی هەبوو لە ناوچەکەدا ، سەرەتا لەگەڵ ڕاپەڕین بوو ، بەڵام نەیدەویست شێوازی چەکداری بگرێتەبەر ، بەڵکو دەیویست بە عەرز و حاڵ و شێوازی دیبلۆماسی داخوازیەکانی جووتیاران بەدەست بێت،چونکە وا بیریان دەکردەوە ناکۆکیی سەرەکیی ئەو کات لە نێوان حکومەت و گەلی کوردستانە. بێ ئەوەی ڕەچاوی ئەوە بکەن ئاغاکانیش (وەکو چین نەك وەکو تاك) لەگەڵ حکومەتن و دژی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانن.

حزبی شیوعی عێراق جەماوەرێکی بەرفراوانتری لەناو جووتیاراندا هەبوو.هەر ئەوانیش دەستپێکی ڕاپەڕینەکە بوون،ڕۆڵی شۆڕشگێڕانەیان بینی و زۆربەی کادر و ئەندامەکانی تووشی گرتن و ڕاونان و دوورخستنەوە بوون، باوەڕیان بەزیاتر تەقاندنەوەی ناکۆکییەکانی نێوان جووتیاران و ئاغا بوو.

ڕۆژنامــەکانی (ئــازادی) حزبــی شــیوعی و (خــەبات) و (نرکــەی جووتیـار)ی پـارتی دیمـوکرات ڕۆڵـی تایبـەتی خۆیـان هـەبوو لـە هۆشیار بوونەوەی جوتیاران .ڕۆژنامەکانی (حزب الاستقلال) و (الاتحاد الوطني) عـەرەبی عێراقــی ڕۆژانــە مەزبەتــەی جووتیارەکانیــان بڵــاو دەکــردەوە و کێشەکەیان بەڕای گشتی عێراقی دەگەیاند. ڕۆشنبیرانیی شار یارمەتی جووتیــارە ڕاپەڕیوەکانیــدا بەتایبــەتی پارێزەرەکــان لــەکاتی گــرتنی جووتیارەکـان بـەخۆڕایی داکۆکییـان لـێ دەکـردن وەك پـارێزەر (عـەونی یوسف و ڕەشید قادر و مەعروف بەرزنجی و عەبدولرەحمان زێـوەر .... هتد). (ئیـبراهیم) ناوێـك قائمقامی مـەخموور بـوو، لـەکاتی سکاڵاکردنی جووتیاران پشتگیری لە جووتیاران دەکرد.

## پیلانی هەندێ لە شێخەکانی کوردستان

دەرەبەگ، ئەو چینە کۆمەڵایەتییەیە، بەمانای هەموو ئاغا و سەرەك عەشیرەت و شێخە خاوەن زەوییە زۆرەکان دێت کە لە ڕژێمی دەرەبەگایەتیدا چینی باڵا دەستن و جوتیار دەڕوتێننەوە و داهاتیان لە زەویوزار دایە. پێکهاتەی زۆربەی شێخەکانی کوردستانیش دەگەڕێتەوە بە خاوەن زەوییە گەورەکان،کە بەهۆی سروشتی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و ساویلکەیی جووتیارانی کوردستان لە ڕووی ئاینەوە زۆر لە زەویی گوندەکان بکەونە ژێر دەستەڵاتی شێخەکان و جووتیارانیش ببنە کۆیلەیان. هەر بۆیەش شێخەکانی ناوچەکە لەگەڵ ئاغاکانی دزەیی یەك بەرژەوەندی چینایەتییان هەبوو،ئەویش زیاتر دەست بەسەر داگرتنی زەویوزارەکان بوو لەگەڵ زیاتر ڕووتاندنەوەی جووتیارەکان , هەر بۆیەش بەجووتە هاوپیلان بوون لە دژی جووتیارەکان بۆ زیاتر بە کۆیلەکردنیان و چاو بەستنەوەیان بە هەموو شتە خورافییەکان. بەتایبەتی پاش ئەوەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان بەرەو قۆناغێکی نوێ هەنگاوی نا،سەلماندی کە شێخ و سەرەك عەشیرەتەکان ناتوانن تا سەر لە دژایەتی داگیرکەران بە شۆڕشگێڕی بمێننەوە، چونکە زۆربەیان ڕۆژ بەڕۆژ بەرژەوەندیی خۆیان زیاتر بە دەوڵەتی داگیرکەری عێراقی و ئیمپریالیزمی بەریتانی گرێ دەدا، لەگەڵ ئەوەش نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە هەندێك لە شێخەکانی کوردستان

نیشتمانپەروەرو شۆڕشگێڕ بوونە و هەمیشە لە دژی داگیرکەران تێکۆشانیان کردووە و ژیانی خۆشیان لەو پێناوە داناوە , وەك شێخ عوبێدوللای نایری و شێخ مەحمودی حەفید و شێخ سەعیدی پیران.... هتد.

هەر لەسەرەتای ڕاپەڕینەکە نوێنەرێکی چوار کەسی لە ئاغاکانی دزەیی خۆیان گەیاندە لای (مستەر بێنت)لە کەرکوك کە نوێنەری سیاسیی حکومەتی بەریتانیا بوو لە کۆمپانیای نەوتی عێراق(I.P.C) (مستەر بێنت) ئامۆژگاریی ئاغاکانی کرد بەوەی بچنە لای شێخ عەبدولکەریمی کەرەبچنە ئەو دەتوانێت کێشەکەتان بۆ چارەسەر بکات. بۆ ئەم مەبەستەش ئاغاکانی دزەیی یەکسەر خۆیان گەیاندە لای شێخ عەبدولکەریمی کەربچنە و کێشەی خۆیان بە شێخ گوت. شێخ لەدواییدا بەئاغاکانی گوت من دەتوانم بەم جۆرە چارەسەری کێشەکەتان بدۆزمەوە بەوەی کەئێوە لەسەر دەستی من تۆبە بکەن و بەکاری ئایینی یەوە خۆتان خەریك بکەن ، منیش ئێوە دەکەم بە (خەلیفە) و دوایش جووتیاران دەکەم بەدەروێش،شتێکی ئاساییە خەلیفەو دەروێش کە دوو برای ئایینی یەکن نابێ لەگەڵ یەك نا تەبا بن.لێرەدا یەکێك لە ئاغاکانی دزەیی ووتی یا شێخ من ناتوانم (تۆبە ) بکەم شێخ ووتی کوڕم کەی پێویستت بە تۆبە نەما بیهێننەوە تەکیە.

هەر لەگەڵ گەڕانەوەی ئاغاکان بۆ ناوچەکەی خۆیان ، تیپەك لە دەروێشەکانی کەربچنە بەسەرۆکایەتی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدولکەریم هاتنە ناوچەکە هەروەك بڕیار درابوو ئاغاکان تۆبەیان کردو بوونە خەلیفەو هەندێ لە جووتیارانیش کران بە دەروێش ، تەڵاقی زۆر لە جووتیارەکانیش چاککرایەوە چاکردنەوەی تەڵاقی جووتیارانیش تەنها بۆ ئەوە بوو کە جوتیاران هاتووچۆی دیوەخانی ئاغا بکەن و لەگەڵ ئاغاکان ئاشتببنەوە.ئەمە وای کرد دووبەرەکی بکەوێتە نێوان جوتیاران و ڕیزەکانیان تێك بدرێت،هەندێك لەو جووتیارانەی هەر سووربوون لەسەر داواکانی خۆیان، گیران یاخود بەناچاری گوندەکانیان جێهێشت و ڕوویان لە شارەکان کرد.

ئەوەی شایەنی ووتنە شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما (گوندێکە لە بناری چیای قەرەچوغ) کە لەسەر تەریقەتی قادرین(واتا ڕێبازی شێخ عەبدولقادری گەیلانی) زۆر دڵگران بوو بە هاتنی شێخ و دەروێشی کەربچنە کە لەسەر تەریقەتی نەقشبەندین(واتا ڕێبازی شێخ مەولانا خالید نەقشبەندین) . چونکە شێخ عەبدولکەریم دەشتی هەولێری بە ناوچەی ژێر دەستەڵاتی شێخایەتیی خۆی دەزانی،هەر بۆیە ئەوانیش تیپەك لە دەروێشەکانی خۆیان بەناوچەکەدا سووڕاندەوە.

لەکاتی خەریکبوون بەکاری دەروێشی یەکێ لە دەروێشەکانی شێخی دارەخورما بۆئەوەی بیسەلمێنێ کە ئەوان لە شێخەکانی کەربچنە

لەرووی ئاینەوە پایە بڵندترن، بە گوللەی دەمانچە لەخۆیدا و مرد هەرچەند شێخ و دەروێشەکان هەوڵیان دا چاکی بکەنەوە بەلاّم بیّ سوود بوو.ئەو هێن و منهێنەی نێوان شێخەکانی دارەخورما و کەربچنە نموونەیەکی بچووکە لەناکۆکی نێوان خاوەن موڵکەکان لەسەر زەویی و دەستەلاّت.دەبیّ ئەو راستییە باش تۆمار بکریّ کە هاتنی شێخ و دەروێشەکانی کەربچنە بۆ ناوچەکە کارێکی سەلبی کردە سەر راپەڕینەکەو بووە هۆیەکی یارمەتیدەر بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینەکە.

## هۆیەکانی دامرکاندنەوەی ڕاپەڕین

نزیکەی ٦ مانگ گێرەوکێشەی نێوان جووتیار و ئاغا بەردەوام بوو، جووتیاران لەو ماوەیەدا هەمیشە بەگیانێکی شۆڕشگێڕانەو بە کۆمەڵ و لەبەردەم ئاغا دەوەستان، لەئەنجامدا سامی دێوەزمەی ئاغایەتی لای جووتیاران شکا،بەڵام ڕاپەڕینەکە کپکرایەوە بەردەوامێتیی خۆی لەدەست دا، دەتوانین خاڵە لاواز و هۆیەکانی نابەردەوامی ڕاپەڕینەکە لەم خاڵانەدا دەست نیشان بکەین:

١) بۆچوونی جوداجودا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەو بەردەوامێتیی ڕاپەڕینەکە لەلایەن (حشع و پدك)، ناتەبایی لەنێو ڕیزی جووتیاران پەیداکردبوو،هەروەك لەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

٢) نەبوونی کۆمیتەیەکی هاوبەشی لەنێوان جووتیارانی ڕاپەڕیوو،کە بەرنامەیەکی گرتگرەو و دیاریکراوی جووتیارانەی هەبێت تا جووتیاران بەرەو ئاسۆی ڕوون ببات.

٣) داخوازیەکانی جووتیاران، داخوازیی ئابووری جووتیاران بوو،نەتوانرا تێکەڵ بە داخوازیی سیاسی و داخوازیی جەماوەری دیکەی کرێکاران و ڕەنجدەران بکرێت.

٤) پەرەنەسەندنی ڕاپەڕینەکەو پەل نەهاویشتنی بۆ ناوچەکانی تری کوردستان و عێراق.

٥) نەبوونی هاوپەیمانێتیی لەنێوان کرێکاران و ڕەنجدەران و ڕۆشنبیرانی شۆڕشگێڕی شار لەگەڵ جوتیاران بەگوێرەی پێویست،هەرچەندە ویسترا خۆپیشاندان بکرێ لە شار , بەڵام زۆربەی ئامادەبووان جووتیارانی لادێ بوون.

٦) زیاتر مەلا و جوتیارە بژێو چاکەکان پێشڕەوایەتیی راپەڕینەکەیان دەکرد، ئەمانەش تا سەر گوڕی شۆڕشگێڕییان تێدا نەما.

٧) ڕۆڵی ئایین، لەبەر ساویلکەیی جوتیارانی کوردستان لەرووی ئایین و خۆشباوەڕیان بە شێخەکان.

## ئەنجام

هەرچەندە گڕو کڵپەی ڕاپەڕینەکە خامۆش کرا،ئەویش بە شەهید بوون و گرتن و دوورخرانەوەی زۆر لەکادیرەکانی ڕاپەڕین، هەندێکیش بەناچاری کۆچیان کرد بۆ شارەکان. لەگەڵ ئەوەشدا جووتیارە ڕاپەڕیوەکان ئەزموونێکی تایبەتیان لەم تێکۆشانە وەرگرت و هەندێ دەسکەوتیشیان بەدەست هێنا وەك:

١. نەمانی بێگاری پێکردن،لەگەڵ نەمانی هەندێ سەرانە وەك پێشکەش و مەڕانەو قشپلانە و سوورانە.

٢. لەزۆر گوند ئاغا نەماو بۆ شارەکان چوون و لەجێگای خۆیان سەرکاریان دانا.

٣. بۆیەکەم جار لەناوچەکە بەکۆمەڵ ڕاپەڕین و ترسی ئاغایان لەدڵی خۆیان لابرد.

٤. هۆشیاربوونەوەی جووتیاران , حکومەتی عێراقی ناچار کرد چاوێك بەژیانی کۆڵەمەرگی جووتیاران دابگێڕێ و زیاتر گرنگی بە گوندەکانی ناوچەکە بدات بە کردنەوەی قوتابخانە و ڕێگاوبان.

## دوا وتە

ڕاپەڕینی جووتیارانی دەشتی هەولێر لەخۆیدا هەندێ داخوازی جووتیارانی ناوچەکەی هەڵگرتبوو، لەهەمان کاتدا هەوڵی لابردنی کۆسپەکانی سەرمڕێی گەشەکردنی کۆمەڵی کوردەواری دەدا،بەڵام هەندێ لەبیر تەسك و ناحەزان هۆی ڕاپەڕینەکەیان بەوە لێکدایەوە ، کە لەئەنجامی پەیدابوونی ئامێری بەرهەمهێنانی دەغڵودان بووە وەك تراکتۆر و دەڕاسە، گوایە جێگای جووتیار دەگرێتەوە لەکاروباری کشتوکاڵی ، ئاغاش پێویستی بە جووتیار نامێنێت[11] ، بەڵام ئەمە لەخۆیدا هەرەشەو چاو لێ سوورکردنەوە بوو لەجووتیاران ،تا زیاتر کڕنوش بۆ یاسا و دابونەریتی دەرەبەگایەتی ببەن، ئەگینا زۆربەی ڕێبەر و هەڵسوڕێنەرانی ڕاپەڕین مەلای ئایینی و جوتیارانی خاوەن زەوی و بوون. ئەمانەش هیچ کات پێویستیان بەوە نەبوو ئیش بۆ ئاغا بکەن لەگەڵ ئەوەش شتێکی ئاساییە جووتیار دژی تراکتۆر و دەڕاسە بێ لە کاتێکدا مەترسی بخاتە بەر ژیانیان (جووتیار بەچاوی دوژمنایەتییەوە سەیری تراکتۆریان کرد ،هەروەك کرێکاران لەسەرەتای پەیدابوونی سەرمایەداریدا تەماشای مەکینەکانیان کرد)[12] بەڵام لەناوەڕۆکدا ڕاپەڕینەکە لەئەنجامی بوونی زوڵم و زۆری کەڵەکەبووی چەندین ساڵەی ئاغاکان بوو لەبەرامبەر جوتیاران وەك سەرانەو بێکاری و نایاسایی ......هتد.

---

١١- الكادر. عدد٩،تموز ١٩٧١ ... ل ٧٨

١٢- عبدالرحمن قاسملو،كوردستان و كورد. ل١١٩٥

## سەرچاوە کوردییەکان:

١- ڕؤوف محمد زهدي، بۆ لەهەقە کەوتنە تەقە

٢- عبدالرحمن قاسملو،کوردستان و کورد

## سەرچاوە عەرەبییەکان:

١- أ. شاميلوف ،حول الاقطاع بين الكرد ترجمة .كمال مظهر

٢- د.كمال مظهر،صفحات من تأريخ العراق المعاصر

٣- نصير سعيد الكاظمي،الحزب الشيوعي العراقي والمسألة الزراعية في العراق

٤- الكادر. عدد٩،تموز ١٩٧١ ...

٥- كريم حسامى ،قافلة من شهداء ثورة كوردستان/ايران

نووسەر لەچەند دێرێکدا

ناو: عباس نادر قادر

* لەساڵی ١٩٦٢ لەشارۆچکەی دیبەگە لەدایك بووە
* خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە دیبەگە تەواوکردووە
خوێندنی ئامادەیی لەئامادەیی ئازادی هەولێر تەواوکردووە
* ساڵی ١٩٨٤ کۆلیجی کشتوکاڵ و دارستانی زانکۆی موسڵی تەواو کردووە
* پیشەی مامۆستایە لە ئامادەیی کشتوکاڵی هەولێر
* خاوەنی دوونامیلکەیە (راپەڕینی جووتیارانی دەشتی هەولێری ساڵی ١٩٥٣)
( کورتە لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ حزبی شۆڕش و ڕزگاری لەکوردستانی باشوور)
* چەندین وتار و نووسینی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردیەکان بڵاوکراوەتەوە دەربارەی مێژوو و سیاسەت و کشتوکاڵ و فۆلکلۆر.....

چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر